


# ڕێبەری دەزگای ڕۆیتەرز بۆ(پەیامنێران)

وەرگێڕانی : عومەر عەبدولکریم

# ڕێبەری دەزگای ڕۆیتەرز بۆ(پەیامنێران)


**لەئینگلیزیەوە/ عومەر عەبدولکەریم قادر**

**تایپ/ عومەر و کاوە**

omerteno@yahoo.com





**لە بڵاوکراوەکانی لقی کەلاری بنکەی ڕووناکبیری گەلاوێژ**

ناوی بەرهەم : ڕێبەری دەزگاری ڕۆیتەرز بۆ ( پەیامنێران )
لەئینگلیزیەوە/ عومەر عەبدولکەریم قادر
تایپ/ عومەر و کاوە
لە بڵاوکراوەکانی لقی کەلاری بنکەی ڕووناکبیری گەلاوێژ
ساڵی بڵاو کردنەوە : 2012

.........................................................

ئەم بەرهەمە بەرهەمێکی سەرچاوە کراوەیە بە
بەرنامەی سەرچاوە کراوە جارێکی تر بەرهەمهاتووە .




.........................................................






ئەم بەرهەمە هەوڵە بۆ زیادکردنی ناوەڕۆکی ئەنتەرنێت بە **زمانی کوردی**

دەتوانین هاوکارامان بن

# پێرست

---

# پێشەکی (Preface)

لەکۆتایی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (2004)دا دەزگای ڕۆیتەرز(Reuters foundation)و پرۆگرامی پەرەپێدانی نەتەوەیەکگرتووەکان(UNDP) بەهاوکاری ئاژانسی هاوکاریی نێونەتەوەیی ئیسپانیا(AECI) پرۆژەیەکیان دامەزراند بۆ باشترکردنی لێشاوی هەواڵی دەستکەوتوو لەسەر عێراق و ناردنی بۆدەزگاکانی ڕاگەیاندن لەعێراقدا، بەمشێوەیە زانیاریە جدی و سەرەکیەکان لەکاتی نەبوونی ئاژانسی هەواڵی نیشتیمانیدا بلاْودەکرێنەوە. بۆئەمەش وێب سایتی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵی ئەسوات ئەلعێراق (www.aswataliraq.info) دامەزرا تاوەکو ڕۆژنامەوانە عێراقیەکان و مێدیاکانی عێراقی هەواڵەکانیانی تێدابلاْوبکەنەوە، هەروەها پرۆژە دامەزراوەکە ڕاهێنان و پرۆگرامی ئامۆژکاریکردنیشی دامەزراند بۆئەوەی یارمەتی ڕۆژنامەوانە عێراقیەکان بدات شارەزایی ڕاپۆرت نوسینیان زیادبکەن و تێگەیشتنیان بۆ پرۆسەی دیموکراسی باشتر بێت، بەتایبەت بەشداریکردن لەهەڵبژاردنەکانی کانونی دووەمی ساڵی 2005 لەعێراقدا.

تیمێکی ناوەندی لەپەیامنێرانی ئەسوات ئەلعێراق لەوگروپانەی ڕۆژنامەنوسان، کە ڕاهێنانیان لەژێرچاودێری پرۆژەکەدا کردبوو تەنها پاش دوو مانگ نزیکەی (500) ڕاپۆرت و هەواڵیان ئاڵوگۆڕو بلاْوکردەوە. دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عێراق زۆرخێرا دەستیان دایە ئاڵوگۆڕکردنەوەی هەواڵولەماوەی چەند مانگێکی کەمدا هاوکاری ئەم پرۆژەیانکرد بۆ بەهێزکردنی. لەسەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی 2005دا تێکرای گشتی مادە بلاْوکراوەکانی هەواڵ نزیکەی( 3000 ) زیاتر بوو .

ئەم زوو سەرکەوتنەو گەشە جێگیرە، پرۆژەی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵەکانی بەقۆناغێك گەیاند، ئێستا ئەتوانرێ بە ئاژانسێکی پەرەسەندوو تەواو سەربەخۆ بناسرێت. بەم دواییەش، هاوپشك و هاوکارانی پرۆژەکە بەتوندی بۆهاوکاری و پاڵپشتیکردن ئەگەرێن بۆ ئەوەی ئاژانسەکە بەزووی پەرەپێبدەن.

ئەم نامیلکەیە بەپێی پرەنسیپەکانی ڕۆژنامەوانی ئاژانسی هەواڵی ڕۆیتەرز نووسراوە و بەشێوەیەك داڕێژراوەو لەبەرچاوگیراوە تاوەکو لە هەواڵ و ڕاپۆرتدا ئامۆژگاری ڕابەرایەتی ڕۆژنامەوانە عێراقیەکان بکات هەرکاتێکیش پێویستیان پێی بوو بەشەکانی ببینن و شارەزاییان زیاد بکات.

ئەم نامیلکەیە لەئەزموونە فراوانەکانی ڕۆژنامەوانانی ڕۆیتەرزەوە وەرگیراوەو ڕێبەرێکی تەواو نیە بۆ هەموو ڕۆژنامەوانان لەهەموو شوێنێکدا، ئەوەش بەزانینی ئەوەی، کە پرۆسەی ڕاگەیاندن ومێدیاکان زۆر فراوانە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر.

هیوامان وایە ئەوەی لێرەدا خراوەتەڕوو، کە ئەزموونی 150 ساڵەی ڕۆژنامەوانانی ئاژانسی هەواڵی رۆیتەرزەو لەوماوەیەدا کاریان تێداکردووە سودمەند بێت.

**لەولیستەی هەڵبژاردنی بوارەکاندا خوێنەران ئەتوانن هەربەشێك، کە گرنگ و بەسود بێت لەبواری کارەکەیاندا هەڵیبژێرن.**

Paolo Lembo
**بەڕێوبەری پرۆگرامی پەرەپێدانی نەتەوەیەکگرتووەکان**

Ricardo Martinez
**بەڕێوبەری گشتی ئاژانسی هاوکاری نێونەتەوەیی ئیسپانیا**

Rosemary Martin
**بەڕێوبەری دەزگای ڕۆیتەرز**

## ناساندن (Introduction)

بۆ پیشەی ڕۆژنامەوانی هیچ بنەمایەکی یەکسان و جیهانی دانەنراوە، کە چۆن ئەبێ کاربکرێ یان مۆڵەتی ئەوە بدەن بەچ شێوەیەك کاربکرێت. ئەمەش لەولاتێکەوە بۆ ولاتێکی ترجیاوازە. هەرلەبەر ئەوەش بنەماو ڕێسایەکی گشتی هەیە، کە زۆربەی ڕۆژنامەوانەکانی سەرتاسەری دونیا لەسەری کۆکن. خاڵگەلێکی گرنگ هەیە دەربارەی ئەوەی، کە چ ڕاپۆرتێك ڕاپۆرتێکی باشەو لەئاستی بەرپرسیارێتیدایە. مەسەلەی گرنگ و سەرەکی دۆزینەوەی ڕاستیەکانەو ئەوەش بەباشترین شێوەیەك، کە کەسێك لەو هەلومەرجەی بەسەری دەبات بتوانێت ئەم کارە ئەنجام بدات.

هەندێك لەو بنەماگشتی و بنچینەیانەی کاری ڕۆژنامەوانی، کە ڕێبەرو ڕێنمایی ڕۆژنامەوانێکی باش بێت (وردبینی ، واقیعگەرایی، ڕاستگۆیی و مرۆڤایەتی یان دادوەریە.)

وردبینی ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە. ئەگەر نەتتوانی زانیاریە سەرەکیەکان وەکو ناوی کەسەکان، ناوونیشان، پۆستەکان و ژمارەکان بەدەست بهێنی ئەوا خوێنەران واز لەخوێندنەوەی بلاوکراوەکەتان دەهێنن و بەشوێن، خزمەتگوزاریە هەواڵیەکانی تردا ئەگەڕێن.

گەشتن بەواقیعگەرایی و بێ لایەنی دژوارترە. زۆرێك باوەڕیان وایە، هەرگیز ناکرێ واقیعگەرابین، چونکە هەموو ڕۆژنامەوانەکان بەهەر شێوەیەك پێشینە یان باکگراوندی خۆیان هەیەو ئەمەش ئەتوانێ کاریگەری بکاتە سەر کارو چۆنیەتی هەڵبژاردنی زانیاریەکان و خستنەڕوویان، کە لەڕاپۆرتەکەدا ئەینووسی. جگە لەمانەش سانسۆرە سیاسی و ئەولەوتیە بازرگانیەکانیش بخەنە سەری.

بەمجۆرە بەڕاهێنان و مەشقکردن ڕۆژنامەوانەکان ئەتوانن پلەیەکی بەرزی واقیعگەرایی بەدەست بهێنن.

بۆ ڕۆژنامەوانێکی جددی و پرۆفێشناڵ ڕاستگۆیی لەپلەی یەکەمی گرنگی پێداندایە. ئێوە ئەتوانن لەخۆتانەوە بەئاسانی سەرچاوەیەکی هەواڵی خەیاڵی دابنێن، یاخود وتەیەك بنووسن و دروستی بکەن.

ئەڵبەت ئەم جۆرە کارە زۆر ئاسانە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر مەترسیدارە بە تایبەتی کاتێك هەواڵی کەسێکی تر بدزن و لە شوێن ئەو هەواڵەی خۆت، کە نووسیوتە دابنێیت، گەر لەم شوێنانەوە دەست بەکاری ڕۆژنامەوانی بکەیت و بتەوێ بەردەوام بیت لەسەر ئەو جۆرە کارانە لە دواییدا جگە لە بەرەو ژوورییەك هیچی تر بە ڕێگات نایەت و سەرکەوتوش نابیت.

لە بنەمای ئەخلاقی فیدراسیۆنی نێودەوڵەتی ڕۆژنامەوانیدا هاتووە، کە ( ڕۆژنامەوان ئەبێت تەنها بەسوود وەرگرتن لە شێوە دادوەرییەکان هەواڵ، وێنە و زانیارییەکانی تر بەدەست بهێنێت).

ڕێگەیەکی دادوەری بوون ئەوەیە هەمیشە خۆت بە ڕۆژنامەوان بناسێنیت و بۆ بەدەستهێنانی زانیارییەکان خەڵکان فریو نەدەیت، هەروەها خۆت لە شوێنی کەسی تر دانەنێیت و هەڕەشەش لە کەس نەکەیت.

## ڕۆڵی پەیامنێر لەکۆمەڵگادا (The reporter's role in Society)

---

یەکێك لەو ڕۆڵە گرنگانەی پەیامنێران لەحکومەتە دیموکراتیەکاندا ئەوەیە، کە ڕایەڵێکبن لەنێوان خەڵکی و دەوڵەتدا. ئەمەش کەناڵێکی دوو لایەنەیە. پەیامنێر ئەتوانێت بڕیارو چالاکیەکانی دەوڵەت باس بکات و ڕاوبۆچوونی خەڵکانیش بگوازێتەوە بۆ دەوڵەت.

پەیامنێر لەم کارانەی خوارەوەدا ڕۆڵی هەیە:-

_ چاودێریکردنی کاروباری دەوڵەت و دادگاو کارگەگەورەکان بۆ پیشاندان و بلاْوکردنەوەی بێ هیوای و سەرکەوتنەکان.بەواتایەکی تر چاودێریکردنی جکوجوڵەکانی دەوڵەت و سەرکەوتن و شکستەکانی.

_ دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی گەندەڵی لەهەموو کون و قوژبنەکاندا.

_ ڕاکێشانی سەرەنجی خەڵکان بۆ گوێ پێنەدان و ناکارایی بەرپرسەکان.

_ بوار بەچینە جیاوازەکانی کۆمەڵگابدات ڕاوبۆچوونەکانیان دەربڕن، نەك تەنها بەشێك لەکۆمەڵگادا هەلی دەربڕینی ڕاوبۆچوونیان هەبێت. واتە کارەکەی هەمەلایەنەبێت.

_کۆمەك و هاوکاری ئەو خەڵکانە بکات، کە ئەیانەوێ دەنگ بدەن و ڕاوبۆچوونیان هەبێ لەناسینی بەرنامە سیاسیەکانی پارتە کارتێکەرەکاندا.

_ بارودۆخی ئابوری وڵات ڕوون بکاتەوە.

**چۆنیەتی(تایبەتمەندیەکانی ) پەیامنێرێکی باش** (Qualities of a good reporter)

ورددبینی (وردەئاژن) ئەگەر پەیامنێران خۆیان کەسانێکی وردبین و بەدیقەت بن، ئەتوانن باشتر پرسیارەکانیان بپرسن.

_ هەستی هەواڵی:

ئەوەیە بزانین چ شتێك هەواڵە، ئەمەش بە گشتی بە مەشق و ڕاهێنان بەدەست دێت، بەلاْم وەك دەرئەکەوێ هەندێ مرۆڤـــــ بە شێوەیەکی سروشتی (غەریزەیی) بۆنی هەواڵ ئەکەن و ئەیدۆزنەوە.

_ ڕاوەستاوی و تێکۆشەری:

ئەوەیە ئەگەر کاتێک بە شوێن زانیارییەکاندا ئەگەڕێیت و لە پشت دەرگای ڕۆتیناتی دامو دەزگاکان، هەڵخەڵەتاندنەکان و نەیارییە یەک لە دوای یەکەکاندا گیرهاتی، خۆت نەدەی بەدەستەوەو ورەت نەڕوخێ.

_ واقیعگەرایی:

پەیامنێرێکی باش ڕاوبۆچونە شەخسیی و دەمارگیرییەکانی لەماڵدا بە جێدێڵێ و ئاوێتەی نووسینەکانی ناکات.

ئەرکی پەیامنێر لەبەرامبەر کۆمەڵگادا ئەوەیە، کە خەڵکان بە ئاگا بهێنێتەوە نەک خەڵکان هانبدات، تاوەکو بۆی ئەکرێت زانیاریەکان بگەیەنێت لە هەموو ئەو لایەنانەی، کە دەرگیرن. هەروەها مۆڵەتی ئەو بدات بە مرۆڤەکان خۆیان بڕیارەکان بدەن، نەک خۆی قسەیان بۆ دروست بکات و ئەوەی مەبەستیەتی ئەوە بکات.

_ گومان و دوودڵی:

کاتێک پەیامنێران لەگەڵ پلەدارەکان و کۆمپانیا و بەرپرسەکاندا گفتوگۆ ئەکەن، ئەبێت بەرامبەر قسەکانیان پلەیەکی پەرز لە گومان و دوودڵییان هەبێت. زۆرجار سەرچاوەکان حەزئەکەن ئەو زانیاریانە بە ئێوە بدەن، کەلە بەرژەوەندی خۆیاندا بێت، ئەڵبەت ئەبێ وریای ئەوە بن ئەو گومان و دوودڵیەتان نەگۆڕێ بۆ گومانی خراپ.

_ لەگەڵ خەڵکاندا ئاسودە بن:

زۆرترین داستان و ماجەرایی هەواڵەکان خەڵکان دروستی ئەکەن. لە پیشەی ڕۆژنامەوانیدا بۆ ئارامی هێمنی بوون جێگایەک هەیە، بەڵام ئەو پەیامنێرانەی بە ئاسودەیی لەگەڵ مرۆڤەکاندا تێکەڵ ئەبن باشترین چانسی گەیشتن بە ڕاستیەکانیان هەیە.

## شێوازەکانی وتار (Article styles)

---

### هەواڵ:

ڕاپۆرتێکی ئاشکراو ڕاستەوخۆیە، لەسەر ئەو ڕووداوانەی، کە لەم ساتە وەختەدا ڕووئەدات. هەواڵی باش پەیوەستە بەوەی تا چ ئەندازەیەک کاریگەری هەبێت و ڕیپۆرتەر لە ڕوماڵکردنیدا چەندێ لێهاتووە. هەواڵەکانیش تەمەنیان کورتە.

### ڕاپۆرت:

ئەو داستانەن، کە کاتی ڕودانیان گرنگ نیەو مەرج نیە وەکو هەواڵ گەرمو گوڕ بن. زیاتریش دەربارەی ئەو شتانەن، کە لەم ڕۆژانەدا ڕووئەدەن نەک ئەو شتانەی، کە ئێستا ڕوویانداوە. بارودۆخی زۆرێک لە شتەکان، ڕووداوەکان، شوێنەکان و بەکورتی ئەو مرۆڤانەی، کە نووسین

لەسەریان ئەتوانیٚ سەرنجی خوێنەران رابکێشیٚ، ئەوانە ئەبنە راپۆرتگەلێکی باش. بابەتگەلێکی وەها بە هۆی تازەییانەوە سەرنجی خوێنەران ڕاناکێشیٚ، هەرلەبەر ئەمەیە پەیامنێران ئەبیٚ سود لە چوستی و چالاکی و شێوە دارِشتنێکی تایبەت و وردەکاریەکان وەربگرن، بۆ ئەوەی سەرنج و تێبینی خۆێنەرانی پێرابکێشن.

### شیکردنەوە:

تێروانینێکی قوڵە لە بابەتێکی گرنگ، کەلە سەر بنەمای زانیاریەکی باوەرپێکراو ئامادەکراوەو تێیدا سود لە بۆچوونەکانی ئەو سەرچاوە جیاوازانەی ناویان هاتووە وەرگیرابیٚ. پێویست ناکات شیکردنەوە تێروانینێك بگوازێتەوە هاورِابێت لەگەڵ عورف و نەریتی کۆمەڵگەدا. هەندیٚ جار باشترین شیکردنەوەکان ئەم تێرِوانینانە بەرەو کێشەو گرفت ئەبەن.

### وتار:

ئەو یادداشتانەیە، کە زۆرجار تێروانینە سیاسیەکانی رۆژنامە ئەگوازێتەوەو لەستوونی سەروتارێکدا بلأو ئەکرێتەوە. ئەمەش زۆرجار لەلایەن پسپۆرەکانەوە ئەنووسرێت.

## چی هەواڵ دروست دەکات؟ یان چ شتێك هەواڵە؟(What makes news?)

---

پێناسەیەکی کلاسیك و کۆنی دەستوری ئەوەی، کە چ شتێك هەواڵە؟:

**ئەگەر سەگێك گاز لەپیاوێك بگرێت. ئەمە هەواڵ نیە، بەڵام ئەگەر پیاوێك گاز لەسەگێك بگرێت. ئەمە هەواڵە".**

ئەم پێناسەیە ئەوەمان فێر ئەکات، کە هەواڵ ئەبێت دەربارەی رِووداوە نائاساییەکان بێت. ئەڵبەت هەمیشە وانابیٚ و بەم شێوەیە نیە.

بریارە ئاساییەکانی دەوڵەت و ریکلامە هەمیشەکانی کۆمپانیا گەورەکان، ئەگەر پەیوەندی بە ژیانی خەڵکانەوە هەبوو یاخود سەرنجی ڕاکێشان لەوانەیە ئەوە هەواڵ بێت.

بۆ ئەوەی بزانین لە رۆژنامەیەکدا کام هەواڵە گرنگترە، ئەوە پەیوەندی بە فاکتەر گەلێکی جیاوازەوە هەیەو یەکێك لەو فاکتەرانەش (دراوسێیەتی)یە. هۆکار یان فاکتەرێکی تر ( هەبوونی پەیوەندی )یە.

خاڵی ئاماژەی زانستی، کە کاروباری جوتیاران ئاسانتر ئەکات یاخود هاوکاری بەشێکی زۆری کۆمەڵگا ئەکات تەنانەت ئەگەر لە وڵاتێکی تردا راپۆرتی لەسەر کرابیٚ و خرابێتە روو ئەکریٚ هەواڵێکی لۆکاڵی دروست بکات و لەلاپەرەی یەکدا دابەزێت و بلاوبکرێتەوە.

بەشێکی زۆر لە هەواڵەکانی ڕۆژانە لەئەو ڕووداوانەوە دێت، کەکاتی ڕوودانیان پێشتر ئەزانرێت.، وەکو کۆنفراسە هەواڵیەکان لەدەوڵەتدا، چاوپێکەوتن و میوانداری پلەدارە دەرەکیەکان، ئاگاداریەکانی ساڵانەو ڕاگەیاندنی کەیسی دادگاکان ئەتوانرێ ئەمانە لەڕۆژمێرێکی ڕۆژانەدا بنوسرێ و هەموو ژورێکی هەواڵیش ئەبێ ڕۆژمێرێکی وەهای هەبێت. هەرچەند هەندێك هەواڵ لەکاتێکی چاوەڕواننەکراوداو بەڕێکەوت ڕوو ئەدەن وەکو بەرکەوتنی دوو شەمەندەفەر یان کەوتنە خوارەوەی فرۆکەکان. هەواڵ گەلێکی تر هەن ئەکرێ بەشێوەیەکی یاسایی و بە سەردانی کردنی پۆلیس، فریا گوزاریەکان و ئاگر کوژێنەوەکان پەیدایان بکەن هەروەکو تاوانە گەورەکان و ڕووداوەکان یان شلەژاویە مەدەنیەکان، کەبنەمان بۆهەواڵ. ڕۆژنامەوانایش بەمانە ئەڵێن پشکنینی ڕۆتینی.

ئەو شوێنانەی تریش، کەئەکرێ هەواڵیان تێدا پەیدا بکرێت:–

_ گروپەکانی فشار (Pressure groups)

لەهەمو ولاتێکدا ڕێکخراوەکان لۆبی لەسەر کۆمەڵێك دۆز ئەکەن، لەوانە وەکو ژینگە، پاراستن و خۆشگوزەرانی ئاژەڵان و مافەکانی مرۆڤو...هتد. لەوانەیە هەندێك لەو ڕێکخراوانە شتێکی تازەیان هەبێ بۆ وتن یان پلانی هەڵمەتێکی تایبەتییان هەبێت. واتە پەیامنێر ئەتوانێت سەردانی ئەم ڕێکخراوانە بکات بۆ بەدەستهێنانی هەواڵ و ڕاپۆرت.

_ گۆڤارە تایبەتمەندەکان (Specialist Journals)

ئەم جۆرە گۆڤارانە هەواڵەکانی تەندروستی و زانست و ژینگە یان پیشەسازی نەوت ڕومال ئەکەن. بەشێوەیەکی سەرەکی ئەم گۆڤارانە بۆ کەسانی پسپۆڕ ئەنوسرێت، هەروەها زۆرجار چیرۆکگەلێکی سەرنجراکێش بلاّوئەکەنەوە، کە جێگای سەرنجی خەڵکانێکی زۆرە.

_ داموزراوە تویژینەوەییەکان (Research institutes)تینك تانکەکان (Think tanks)

هەندێك لەم دامەزراوانە لەسەر هەلومەرجی کۆمەڵگا یان باری ئابوری لێکۆڵینەوە ئەنجام ئەدەن. هەندێك هەوڵئەدەن بۆ ئەوەی ئارەزوو خواستەکانی ئاییندە پێشبینی بکەن. هەندێکی تریش سیاسەتی ولاّتە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتریدا بەراورد ئەکەن.

هەریەکێك لەم دامەزراوانە ئەتوانن چیرۆکگەلێکی سەرنج ڕاکێش پێشکەش بکەن و پەیامنێر ئەتوانێ سودیان لێوەربگرێت بۆ ڕاپۆرت و هەواڵ.

## _ سالیادەکان (سالوەگەڕەکان)

بریتین لەچاوخشاندنەوە بەڕووداوە گرنگەکانی ڕابردوودا. تێبینی ئەو گۆڕانکاریانە بکەن لەو ماوەیەدا ڕویانداوە. واتە پەیامنێران ئەتوانن سالیادێك بکەنە هەواڵ یان ڕاپۆرتێکی تەواوی لێ بەدەست بهێنن.

## _ بەداواداچوون

بریتیە لەگەڕانەوە بۆ ئەو ڕووداوە گەورانەی چەند هەفتە، چەند مانگ یان چەند ساڵ، لەمەوپێش ڕوویداوە. بۆیان بگەڕێ و بزانە ئەوکەسانەی بەو بەسەرهاتەوە تووشبوونە چی ڕوویداوە بۆیان؟ یان چیان لێ بەسەر هاتووە؟

## _ پیشاندان و خستنەڕووی هەواڵەکان (Presenting news)

هەرچەند بەسەرهاتو ڕووداو باش بێت، پەیامنێران پێویستە بەجۆرێك بیخەنە ڕوو وابکەن خەڵکان حەزبکەن بیخوێننەوەو چێژی لێوەربگرن. ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکان مامەڵە لەگەڵ لێشاوو هێرشی زانیاریەکاندا ئەکەن، کە لەسەرچاوە جیاوازەکانەوە بەردەستیان ئەکەون یان لەوانەیە لەناو وێستگەیەکی قەرەباڵغی شەمەندەفەردا بیخوێننەوە. بۆ ئەوەی سەرنج و تێبینیان ڕابکێشی پێویستە چیرۆکە هەواڵیەکان ڕوون و کورت و پوخت و سەرنج ڕاکێش و کارتێکەرو ڕەنگداربن.

## هەرەمی هەڵگەڕاوە (The inverted pyramid)



ئەمە شێوازێکی کلاسیکی داڕشتنی چیرۆکە هەواڵە. پەیامنێری باش دەتوانێت بەسود وەرگرتن لەم شێوە بنچینەییانە هەواڵەکەی لەچوار یان پێنج پەرەگرافدا بگەیەنێت. ژانرە کلیلیەکانی هەواڵ لەسەرەوە دابنێ و پاشان بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و بەپێی گرنگی هەواڵەکە بەداویدا بینووسە. ئەگەر سەرنووسەران بۆ زانیاریەکان پێویستیان بەبۆشایی زۆرتربوو ئەتوانن کۆتایی چیرۆکە هەواڵێکی لەم شێوە بسڕەنەوە.

پەرەگرافی یەکەم، واتە(لید) یان پەرەگرافی لید گرنگ و بەبایەخەو ئەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە:-

_چی ڕوویدا؟

_ کێ تووشبوو؟

_ کەی ڕوویدا؟

_ لەکوێ ڕوویدا؟

_ چۆن ئەزانم؟ (سەرچاوەی هەواڵەکە)

ئەگەر لەپەرگرافی یەکەم یان دووەمدا وەڵامی کێ، چی، کەی، کوێ، بۆ وە چۆنت نەدایەوە، ئەوا ئەبێ هەوڵی ئەوە بدەی هەواڵێك بخەیتە ڕوو بیخوێنرێتەوە.

لید تەنها ئەو زانیاریانەی هەیە، کە بەبایەخن. ئەو وردەکاریەکانی تر لەخوارەوەی هەواڵەکە دابڕێژە. ناوی کەسەکان، ئەگەر کەسانێکی گرنگ نین و پلەوپایەیان نیە لەلیددا مەنووسن.، چونکە یەکسەر سەرچاوەکە بەخوێنەران ئەڵێیت. هەواڵەکە چەند باوەڕ پێکراوە هەندێك جاریش ئەتوانی ناوی سەرچاوە لە پەرەگرافی دووەمدا بنوسی، بەڵام نەك خوارتر.

وا باشە پەرەگرافی دووەم وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە ، کە لەلیددا ئاماژەی پێنەدراوە. وەکو بۆ؟وە چۆن ئەوە ڕوویداوە؟ پاشان ئەم پرسیارە گرنگە لەخۆت بپرسە: -

## بۆ ئەم هەواڵەم بەلاوە گرنگە؟ ئەی بۆ چی؟

دەقی بەسەرهاتەکە دەستنیشان بکە. ئەوە بۆ خوێنەران ڕوونبکەوە بۆچی ئەم هەواڵە شیاوی ئەوەیە بخوێنرێتەوە. لەوانەیە بەلای تۆوە سەرنج ڕاکێش و بەنرخ بێت ، بەڵام ئەگەر بەلای کەسانی ترەوە وا نەبوو ئەوا کاتەکەتان بەفیڕۆ داوە.

لەپاش ئەوەی بەشە بناغەیەکانی هەواڵتان ڕوونکردەوە پێویستت بە وتەی وەرگیراوە بۆ ئەوەی بایەخ و متمانەی لیدەکە زیاتر بەهێز بکەی. وتەی وەرگیراو هەواڵەکە بەهێز ئەکات، هەروەها وا پیشان ئەدات ئەوەی نووسیوتە لەسەر بنەمای بەڵگە بووە.

ئەو هەواڵەی ڕۆیتەرز، کە لەخوارەوە ئەیخوێنیتەوە ئەوە ڕوون ئەکاتەوە چۆن وەڵامی پرسیارە بنچینەییەکان ئەداتەوە هەروەها ئەوەش دەرئەخا، کەچۆن سەرچاوەی هەواڵ بەکارهاتووە، لە پەرەگرافی دووەمدا دەقی هەواڵەکە نووسراوەو لە پەرەگرافی سێیەمدا وتە وەرگیراوەو هەواڵەکەی تۆکمە کردووە.

_سی ئول (ڕۆیتەرز) کۆریای باکور وتی" لە هەینیدا ئامادەیە بگەڕێتەوە بۆ دانیشتنی شەش قۆڵی بەو ئامانجەی ئەگەر هەلو مەرج لەبار بێت کۆتای بەبەرنامە ئەتۆمیەکەی خۆی بهێنێت- یونهاپ ئاژانسی هەواڵی کۆریای باکوور راپۆرتێکی لەمیدیا دەوڵەتیەکانی حکومەتی پیۆنگ یانگدا بلاوکردووەتەوە. ئەم لێدوانە ڕۆژێك بەر لەوە بلأوئەکرێتەوە، کە سەرۆك "بۆش‌و هو جین تاو" سەرۆك کۆماری چین نیگەرانی خۆیان لەسەر بەرنامەکانی حکومەتی کۆمۆنیستی (کۆریای باکوور) کە لە گۆشەگیریدایە دەربڕیبوو هەروەها بەڵێنیان دابوو هاوکاری دەستپێکردنەوەی وتووێژەکان، کە بۆ ماوەی ساڵێك وەستاوە بکەن.

ئێمە هەموو کاتێك ئامادەی وتوێژین ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵوێستێکی متمانە پێکراو لەخۆی پیشانبدات‌و هەل‌ومەرجێکی دوروست فەراهەم بکات بۆ وتووێژ. خاوەن پۆستەکانی کۆریای باکوور هەروەکو ئاژانسی پیۆنگ یانگ(یونهاپ)( yon hap) ڕاپۆرتی لەسەرداوە. بەیەکێك لە ئەندام پەرلەمانەکانی ڕوسیایان وتوە، کە سەردانی کردووە.

پاش ئەم وتە وەرگیراوە یەك یان دوو لەباکگراوندە بنچینەیەکان دابنێ بۆ ڕوناکردنەوەی ئەوەی بۆچی ئەم هەواڵە ئاوا بووەو چی لە پشتیەوە ڕوویداوە.

لەخاڵی یەکەمدا، پاش چوار پەرەگراف هەواڵەکە لە ڕۆژنامە یان سایتەکاندا بلاو ئەبێتەوە وخاڵە بنچینەییەکان ئەگاتە خوێنەران. لەهەمانکاتیشدا ئەتوانن هەواڵەکە پەرە پێبدەن‌و بەدرێژەی زیاترو وتەی وەرگیراوو پێشینەوە وردەکاری بۆ بکەن.

## دیاریکردن و ناساندنی لید (Identifying the Lead)

---

نووسینی لیدێکی بێ کەموکووڕی زۆر گرنگە بۆ ڕاپۆرتە هەواڵێکی باش‌و شایەنی ئەوەشە کاتی پێوە بەسەربەری. هەندێك جار لە ڕاپۆرتە هەوالێکی ئالۆزدا لەوانەیە یەکسەر نەتوانی لیدێك پەیدا بکەیت لەبەر ئەوە هەوڵبدە بە نزیك بوونەوە لەم ئاراستانەی لەخوارەو هاتوون سەری بابەتەکە بدۆزیتەوەو پاشان باشترین ڕێگا بۆ پیناسەی بەسەرهاتەکە هەڵبژێری.

1- وێستگەی پاس(The bus stop)

وای دابنێ لەناو وێستگەی پاسدایت‌و ئەتەوێت هەواڵێك (بەسەرهاتێك ) بۆ هاوڕێکانت باس بکەیت، لەکاتێکدا پاسەکە لێئەخوڕێت، پێویستە هاوار بکەیت‌و بنچیتەی ماجەراکەی بۆ بڵێی پێش ئەوەی گوێی لەدەنگت بێت،

2- داپیرە(The grandmother)

وابزانە لە ڕێگەی تەلفۆنەوە هەواڵێك بە داپیرەت ڕا ئەگەیەنیت.

3- هاوڕێ (The friend)

وەلأمی ئەو پرسیارەی،کە هاوڕێکەت لێت ئەپرسێت بدەرەوە" چی ڕویدا؟" "پێت ئەڵێم"...

4- سەردێڕ (مانشێت) (The headline)

یەکەمجار مانشێتەکە بنووسە، لەبەر ئەوەی بیرت لەسەر خاڵە بنچنەیی و کلیلیەکان جێگیر ئەکات.

شایەتحاڵەکان:﴿ لەلایەن جەنەرالی یاخیبوانەوە تەقە لە پاشاکرا﴾

5- کلیلی وشە (The keyword)

وشەیەکی کلیلی بناسێنەولیدەکەی لەسەر دروستبکە. ئاژاوەکان(Riots)

## ئاراستە جیاوازەکانی لید(Different lead approaches)

---

ئەو لیدانەی، کەپێویست ناکات کەسایەتی ماجەراکەی تێدابناسرێت

سێشەمە، سەرۆك کلینتۆن وتی: پلانی ئەوەی هەیە هێزێکی زۆر ڕەوانەی کۆسۆڤۆ بکات لەبەر ئەوەی توندوتیژی لەوهەرێمەدا هەربەردەوامە.

بەلاّم دڵنیابن خەڵکان یەکسەر خۆیان کەسایەتی ماجەراکە دیاری ئەکەن وئەیناسن، ئەگەرنا_ئەتوانن بینووسن.

فەرمانبەرێکی پایەبەرزی ئەمریکا وتی: دەوڵەت سەرقاڵی پلانێکە بۆ ناردنی هێزێکی زۆر بۆ کۆسۆڤۆ...

دان مۆرگان یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، یان پلە دارێك، کە نەیویست ناوی ئاشکرابکرێت وتی.....

## لیدە پوختەکان(Summary leads)

ئەم لیدانە کاتێك سودی لێوەرئەگیرێ، کە چەند ڕووداوێك ڕوویان دابیّ و هیچ کامیان ئەوەندە گرنگ نەبن لیدێك پڕبکەنەوە، بەلاّم پێکەوە گۆڕانکاریەکی سەرەکی بخەنە ڕوو، یان کاتێك بەکار ئەهێنرێن، کە ڕیپۆرتەر کاتی نەبێت لێکۆڵینەوە لەسەر هەموویان بکات.

بۆنموونە/

دەوڵەتی تەیموری ڕۆژهەلاّت(350)هەنگاوی نوێی خستووەتەڕوو بۆئەوەی سەرنجی وەبەرهێنەرە بیانیەکان ڕابکێشێت، بەتایبەتی لەبوارەکانی نەوت و گاز. لەیەکێك لەم هەنگاوانەدا...

## لیدە چەند بەشیەکان(Multiple element leads)

---

کاتێك دوو ڕووداو پێکەوە ڕووئەدەن و ناکرێ یەکێکیان لەویتر جیابکرێتەوە.

بۆنموونە/

پێنج شەممە دەوڵەتی بەریتانیا ڕایگەیاند، کە وەزیری بەرگری (تۆم جۆنز)ی دەرکردووەو هەموو بەرنامەکانی کڕینی چەکی ڕاگرتووە، کە لەڕاپۆرتی ڕۆژنامەکاندا لەسەر گەندەڵیەکانی وەزارەتی بەرگری نووسرابوو، لەهەمان کاتدا ئەگەر ئەمانە زۆر بوون بۆ ئەوەی لەلیددا بیاننووسی ئەتوانی بەشی سەرەکی تر لەلیدەکەدا بەکاربهێنی و لەپەرەگرافی دووەمدا بینووسی.

بۆنموونە/

پێنج شەممە دەوڵەتی بەریتانیا وتی: تۆم جۆنزی وەزیری بەرگری دەرکردووەو هەموو کڕینەکانی چەکی ڕاگرتووە.

ئەمەش بەدوای ئەوەدا دێت، کە لەڕۆژنامەکاندا بانگەشە بۆ هەبوونی گەندەڵی لەوەزارەتی بەرگریدا کراوە.

- ➢ لیدە تەفسیریەکان(Interpretative leads)

_ بەکارهێنانی سەرچاوەکان ئاکامەکانی ڕووداوێك ڕوون ئەکاتەوە.

بۆنموونە/

سەرۆك کلینتۆن پێنج شەممە ڕایگەیاند: پلانی ئەوەی هەیە(3000)هەزار سەربازی ئەمریکی لەکۆسۆڤۆ دەربکات. کاتێك، کە پلەدارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان وتویانە ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی زۆرێك لەصرب نەژادەکان لەو ویلایەتە ڕابکەن.

کاتێك لەم جۆرە لیدانە ئەنووسن دڵنیابن لەوەی ئەو بەڵگانەی هەتە لەسەرەوە هاتووە_ لەسێیەم یان چوارەم پەرەگرافدا و واباشترە گەر کرا ناوی سەرچاوەش بنووسی،

بۆنموونە/

جان سوچیسکای بەڕێوبەری ئاژانسی پەنابەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان (UNCHR) لەبەلگراد، بەم ڕێپۆرتەری ڕۆیتەرزی وت"تاکو ئێستاش لەیەك حەفتەدا نزیکەی(50) صربی ئەو هەرێمە بەجێدێڵن، لەبەرئەوەی ئەترسن ئەڵبانیەکانی کۆسۆڤۆ تۆڵەیان لێ بکەنەوە، ئەم هەنگاوە تەنها پرۆسەی بەجێهێشتنەکە خێراتر ئەکاتەوە".

➢ سەرچاوە لەلیددا(Source in the lead)

بەشێوەیکی ئاسایی سەرچاوە لەکۆتایی لیدی هەواڵەکەدا دێت.

بۆنموونە/

هەینی نەتەوەیەکگرتووەکان وتی"لەئاکامی جەنگی بۆسنەدا زیاتر لەنیو ملیۆن ئاوارە لەسربیادا دەژین،"

بەڵام لەهەندێ کەیسدا بەتایبەتی کاتێك لەڕاست و دروستی زانیاریەکان گومانت هەیە یان کاتێك زیانیاریەکان جەنجاڵین باشترە سەرچاوەکە لەیەکەمەوە بێت.

بۆنموونە/

یەکێك لەسەرکردە سیاسیە نەیارەکانی خەڵکی مەنچوقستان وتی" لەشەش مانگی ڕابردوودا زیاتر لە(5000)پێنج هەزار کەس لەلایەن دەستە توندڕەوەکانەوە کوژراون".

## چەند ڕێگایەك بۆ باشترکردنء بەرەوپێشبردنی لیدەکان (Ways to improve leads)

---

هەمیشە لەکاتی ئامادەکردنی هەواڵو ڕاپۆرتدا فرمانە بکەر دیارەکان بەکاربهێنە نەك بکەر نادیارەکان، چونکە زۆر ڕاسترو کورتترن. بۆنموونە/

سەربازەکانی فەرەنسا بە سەرۆکایەتی ناپلیۆن پێنج شەمە مەنچوقستانیان داگیر کرد. پێنتاگۆن وتی.

مەنووسن:

پێنج شەمە مەنچوقستان لە لایەن سەربازەکانی فەرەنساوە بەسەرۆکایەتی ناپلیۆن داگیرکرا.

_ بەپرسیار هەواڵێك مەنووسەو دەست پێمەکە، چونکە ئەو شێوەیە تەنها لەڕاپۆرت نووسیندا ئەنجام ئەدرێت.

_ لە نازناوە کوتکراوەکانو ناوی درێژی کەسەکانو شوێنەکان دوور بکەونەوە، مەگەر بەناوبانگ بن.

بۆنمونە/

واباشە بنووسی ڕێکخراوی ئاسایشی سەرەکی ئەوروپا باشترە لەوەی بنووسی ڕێکخراوی ئاسایشو هاوکاری لە ئەوروپا (OSCE).

واباشە بنووسی ئاژانسی پەنابەرانی ڕێکخراوی نەتەوەی یەکگرتوەکان باشترە لەوەی بنووسی کۆمیسیۆنی باڵای نەتەوەی یەکگرتوەکان بۆ کاروباری پەنابەران (UNHCR).

_ تەنها کاتێك وتەی وەرگیراو لە لیددا بەکاربهێنە، کە زۆر کاریگەرو کارتێکەر بێت.

فەرماندەی هێزەکانی یوگسلاڤیا هۆشداری دا (NATO) "جەهەنەم لەسەر زەویدا" تاقیدەکاتەوە ئەگەر هێزە سەربازیەکانیان بیانەوێ بچنە هەرێمی کۆسۆڤۆوە.

_ هەوڵبدە کاتی ڕانەبردوو بەکاربهێنی –

بنووسی چین بە نیازی پلاندانانە بۆ .... باشترە لە چین پلانی دانابوو بۆ ......

## خاڵە سەرەکیەکان بۆ نوسینی چیرۆکە هەواڵ (Key points for writing stories)

---

_ وردی و دیقەت (Accuracy)

ئەگەر نەتوانی زانیاریە سەرەتایی و بنچینەییەکان بە دروستی بنووسی ئەوا هیچ کەس باوەڕ بەو شتانەی دیکەت ناکات کە نووسیوتن.

هەرگیز وا دامەنێ خوێنەرەکانت لەوەو پێش زانیاریان لەسەر هەواڵەکەت هەبووە. هەرکاتێك هەواڵێك ئامادە ئەکەی تەنانەت ئەگەر هەندێ جار وتراوە ئەبێت باکگراوندو ڕوونکردنەوەی بنەڕەتی بۆ بدەی.

وادابنێ هەواڵ بۆ کەسێکی خوێنەر ئەنووسی، کە مانگێك لەسەفەری دەرەوە بووەو تازەهاتوەتەوە بۆ وڵات.

_ بیرتان کراوەبێت (Be open minded)

هەرگیز وابیرمەکەرەوە، کە کەسێك ڕاست ئەکات یان هەڵەیە.

_ شەفافیەت(Clarity)

مەکەوە داوی ڕەنوس و وردەکاری و درێژە پێدانەوە. زمانێکی سادەو ڕوون بەکاربهێنە ( H. G. Wells) ئێچ جی وێلز، نووسەرو ڕۆژنامەوانی بریتانی جارێك وتی "من بەو ڕاستیەی، کە ڕێدەکەم بەو ڕاستیەش ئەنووسم، لەبەرئەوەی ئەوە باشترین ڕێگایە بۆ گەشتن بە ئامانج".

_ شانەی بکە (Comb it)

لانی کەم دوو جار بە ناو ئەو هەواڵەدا بچۆرەوە، کە نووسیوتە، هەڵەکان و ئەو شتانەی ناپێویستن لێدەربێنە، ڕەنوسەکان بپشکنەو هەروەها ڕێزمان و هەموو شتەکان، بە تایبەتی ناوی کەسەکان و شوێنەکان.

هەرگیز پێشبینی ئەوە مەکە کەسێکی تر هەڵەکانی تۆ بگرێت و ڕاستیان بکاتەوە.

_ وتە وەرگیراوەکان (Quotes)

هەمیشە بە دوای وتە وەرگیراوە ڕەنگدارو باشەکاندا بگەڕێ- ئەوانە زیندوویی و ڕاستی و متمانە بەهەواڵ ئەبەخشن. وتەی وەرگیراوی بێ شومار سەختە بۆ هەرسکردن، زۆر بەکاریان مەهێنە.

ئەگەر لێدوان و قسەکان لە هەواڵەکەدا زۆربوون، ئەوا بە شێوەی ڕاپۆرتی بینوسەو کەمێك وتەو لێدوانی سەرەکی بەکاربهێنە لە گەڵیدا.

_ خاڵە سەرەکیەکانی ناو هەواڵەکەت بە شێوەیەکی لۆجیکی و یەك لەدوای یەك پێکەوە پەیوەستیان بکە، بۆ ئەوەی یارمەتی خوێنەران بدات بە شێوەیەکی لۆجیکی لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر بچن. با هەواڵەکەت بەدواداچون و لەسەر ڕۆشتنی تێدا بێت...

_ هاوسەنگی(Balance)

دڵنیابە لەوەی ئارەزوو خواست پێشکەش ناکەیت یان بیروبۆچوونەکانت تێکەڵی هەواڵەکەت ناکەیت. دڵنیابەلەوەی، کە مشت و مڕو جیاوازی هەردوو لایەن ئەگوازیتەوەو چانسی ئەوە بەهەموو کەسێك بدە، کە تاوانبارکراوە بەخراپە کردن بۆئەوەی وەڵام بداتەوەو ڕای خۆی دەربڕێت.

لەوشەکانی وەکو بانگەشەی کرد"ئیدیعای کرد" دووربکەوەرەوە، کە وات لێ بکات گومان لەقسەکانی بکەیت چی وتووە. لەوشەکانی وەکو "ترسان یان هیوای خواست"یان ئەترسێت خۆت بەدوور بگرە لەبەرئەوەی وەها دەرئەکەوێت تۆ لایەنگری لایەنێك ئەکەیت و لایەنێك ئەگریت.

وشەی"ڕێگەی پێدا"مانای ئەوە ئەگەیەنێ کەسێك هەندێ کاری هەڵەی کردبێ، وشەکانی"جەتی کردەوە"یان"ئاماژەی دا"ئەوە ئەگەیەنن تۆش باوەڕت بەقسەکەرە چی ئەڵێت. واتە هاوبیری لەگەڵ قسەکەردا. لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا وشەی بێلایەنی "وتی"بەکاربهێنە لەهەمووی باشترە.

_ باکگراوند، پێیشینە(Background)

بۆ هەموو هەواڵەکان باکگراوندو پێشینە شتێکی بنچینەییەو پێویستە. ئەوەش لەلابەلای ئەو هەواڵەکە دادیدەرێژی بیچنەو لەبری ئەوەی پارچەیەکی گەورەی چەند پەرەگرافی پێشینە بهێنی هەربەوشێوەیەی، کە هەواڵەکە لەسەرەتاوە تاکۆتایی باس ئەکەی پێشینەکان بچوك بکەرەوەو لەلابەلای هەواڵەکەدا دایبنێ.

خاڵە سەرەکیەکانی باکگراوندەکە لەناو تێنووسی تێبینیەکاندا بنووسەو لای خۆت دایان بنێ و خەتێك بەسەر ئەوانەدا بهێنە، کە لەهەواڵەکەدا بەکاری ئەهێنی.

_ ڕەنگ (colour)

وردەکاریەکان زیندوویەتی بەهەواڵ ئەبەخشن و کەسێك واقیعی تر پیشان ئەدات یان ئەوە بۆ خوێنەران ئەخاتە ڕوو، کە تۆ بەڕاستی لەو جێگایەدا بوویت .

## سەرچاوەکان (Sources)

---

وەکو یاسایەکی گشتی هەتا سەرچاوەت بۆ نووسینی هەواڵ زیاتر بێ باشترە. گرنگی هەواڵ لەوەدایە سەرچاوە بنچینەییەکانی تێدابێت و ناویان هێنرابێت.

چاندن و پەروەردەکردنی سەرچاوە نوێیەکان هەرگیز بەکات بەفیڕۆدان ناژمێردرێت.

نووسەر و ڕۆژنامەوانی بریتانی سەدەی هەژدەیەم ساموێل جۆنسۆنJohnson (Samuel )

جارێك وتوویەتی "بەڕێز، هەر ڕۆژێك تێپەڕێ و من ئاشنایەتیم لەگەڵ کەسێکدا نەکردبێ ئەو ڕۆژەم بەفیڕۆ داوە."

زۆربەی سەرنووسەران بۆ ئەوەی هەواڵێکتان لێوەربگرن داوای دوو سەرچاوەی سەربەخۆ ئەکەن پێش ئەوەی هەواڵەکە بەکاربهێنن وبلاوی بکەنەوە.

لەهەندێك کەیسی تردا یەك سەرچاوەش بەسە بەمەرجێ ئەو سەرچاوە متمانە پێکراو بێ و دڵنیابی لەوەی، کەدەربارەی کەیسەکە شتێك ئەزانێ و زانیاری هەیە. هەوڵبدە دووربکەویتەوە لەوەی، کەناوی سەرچاوە نەبەیت. هەرگیز ئەو سەرچاوانە بەکارمەهێنە، کەلێدوانەکانیان جەنجاڵین و بانگەشە ئەکەن ناویان نەهێنرێ. هێرشکردن و سکالا لەپشت دەمامك و رووپۆشەکانەوە قبول ناکرێ و پەسەند نییە. لەگەڵ سەرچاوەکانتدا دادوەرانەبە بۆ بەرژەوەندی خۆت و ئەوانیش.

_ ئەوسەرچاوانەی ناویان دەهێنرێ هەمیشە پەسەندترن لەو سەرچاوانەی، کەناویان نییە. لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا وتووێژو گفتوگۆبکە چۆن بیانناسێنی و ناویان بهێنی. تاپێت ئەکرێ هەوڵبدە بەشێوەیەکی دیار ناوی سەرچاوەکە ببەیت."دیپلۆماتێکی رۆژئاوایی،کەلەوتووێژەکاندا بەشداربوو" باشترە لە "سەرچاوەیەکی دیپلۆماتیکی".

_ باکگراوند، پێشینە(Background)

کاتێك سەرچاوەیەك لەسەرپێشینە زانیاریت ئەداتێ بەگشتی ئەوە مانای ئەوەیە، تۆ ناتوانی مادەکانی زانیارییەکە بەکاربهێنی، مەگەر لەسەرچاوەیەکی سەربەخۆی تریش پەیدای بکەی و زانیاری تر وەربگری.

_ سەرچاوە دەوڵەتییەکان(Official Sources)

لێدوانە حکومییەکان، ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان، بانکە ناوەندییەکان و سەرچاوە دەوڵەتییەکانی تر، بەگشتی بەوردی و بەئاگایی ئەخرێنە ڕوو، بەلام ئەبێت بۆ وردەکارییەکان بیاندۆشین لەبەرئەوەی ئەوانە دڵنیاترین سەرچاوەن تەنانەت ئەگەر وێنەیەکی تەواوت ماجەراکە دەستنەکەوێت.

_ پسپۆڕو شارەزایان(Academics, experts)

ئەمانە زۆرجار باشترین سەرچاوەن لەبەرئەوەی بەگشتی ئەم جۆرە سەرچاوانە سەربەخۆن، هەرلەبەر ئەوە ئەتوانن بێلایەنانە زانیاریت بدەنێ، کە بەئاسانی ئەو زانیاریانە لەفەرمانبەرانی دەوڵەتی وەرناگیرێ.

_ سەرچاوە بیانییەکان(Foreign sources)

دیپلۆماتەکان، ڕێکخراوە ناحکومیەکان، کەسانی نەتەوەیەکگرتووەکان، کۆمپانیابیانیەکان، زۆرجار ئەمانە بەسوودن، چونکە وڵات بەباشی ئەناسن و شارەزان، بەلام لەڕەهەندێکی بیانیەوە.

_ ڕێکخراوە فەرهەنگی و ئاینی و پیشەییەکان، ئەمانە ئەتوانن هەواڵ و ڕاپۆرتەکەت دیارو زەقتر بکەنەوە. پەرستگاکان چەندین ئەندامیان هەیەو زۆربەیان لەسەرتاسەری وڵاتدا بەربلاون، هەرلەبەر ئەوە ئەزانن لەوڵاتدا چی ڕووئەدات.

_ سەرچاوە شەقامییەکان(Street Sources)

بەکارهێنەرەکانو ئەو ژن و پیاوانەی لەناو شەقامەکاندان هەمیشە بەهای ئەوەیان هەیە لەگەڵیاندا قسەیکەیت بەمەرجێك لەگەڵ زۆرێك لەخەڵکاندا قسەبکەیت بۆئەوەی وێنایەکی چەند لایەنە لەبیروڕاکان بۆ بابەتەکە بکێشیت و بدۆزیتەوە.

_ میدیاکانی تر(Other media)

هەندێ جار هیچ ڕێگایەکی تر نیە جگەلەوەی لەمیدیاکانی ترەوە زانیاری وەربگرین. بۆنموونە/ کاتێك کەسێکی دیارو بەرچاو لەگەڵ میدیایەکدا چاوپێکەوتنێکی تایبەت ئەنجام ئەدات، هەرچەند ئەگەر هەواڵێك لەمیدیایەکی ترەوە وەردەگریت ئەبێت زۆر بەدەگمەن ئەو کارە بکەیت و تەنها لەمیدیا بەناوبانگەکانەوە بێت و پێویستە ناوی سەرچاوەکەش بهێنیت.

"ئەکرێ هەواڵەکەت ببینم؟" پێش چاپکردن و بلاوکردنەوە لەبەرانبەر سەرچاوەکاندا خۆتبگرە لەم داواکاریانە، کەهەواڵەکەت ببینن. ئەگەریش ئەوکارەت کرد و هەواڵەکەت پیشاندان تەنها بۆ بەرزکردنەوەی وردی هەواڵەکەت ئەو کارە بکە. نابێت واتاو ناوەرۆکی وتە وەرگیراوەکان بگۆڕیت، هەروەها مۆڵەتی کۆتایی بهێڵەوە بۆئەوەی سەرچاوەکە نەنیشێە سەر هەواڵەکەت.

## ڕاپۆرتەکان(Features)

---

ڕاپۆرتەکان هەتا هەتایی نین. واتە پەیوەندیان بەکاتەوە نیە یان ئەتوانن لەگەڵ هەواڵێکی ڕۆژانەدا بن. بۆنموونە/

کاتێك هەواڵی بومەلەرزەیەکی گەورە یان ڕووداوێکی سروشتی هاوشێوەی ئەوە ڕومالْ ئەکەیت، ڕێپۆرتەری باش پێویستە هەواڵێکی تەواو بنووسێت و هەموو گۆشە نیگاکان ڕومالْ بکات. هەروەها واباشترە لەگەڵ ئەوەشدا ڕاپۆرتێکی ڕەنگدارو پوخت بنووسێ و ئامادەی بکات. بۆنموونە/

کاتێك لادێییەك بەدەستی ڕووت خەریکی زەوی هەڵکەندنە بۆ ئەوەی کچە ونبووەکەی بدۆزێتەوە. ئەم ڕاپۆرتە ئەبێتە هۆی ئەوەی ڕەهەندە مرۆڤایەتیەکانی بابەتەکە باشتر دەربکەوێت. بنەما گشتیەکانی نووسینی لیدی هەوالْ تاڕادەیەك دیارو ئاشکرایەو ناگۆڕێت، بەلاّم بۆ نووسینی ڕاپۆرت ئەتوانین بێژین هیچ یاسایەك نیە. گرنگ ئەوەیە کاری خۆی بکات و کاریگەربێت و خوێنەر بۆناو بابەتەکە ڕابکێشێت.

### چەند لیدێکی ڕاپۆرتەکانی ڕۆیتەرز:-

_ لۆس ئەنجلس(LOS ANGELES)

ڤیکتۆر خۆی لادا تەماشای کردو چاوی بەئەو کەوت– بێ وشەیەك وادیاربوو کۆنایی(Connie) ئەیزانی چی ئەویست، لەوانەیە ئەوکەسە بووبێ، کە ڤیکتۆریش بەشوێنیدا ئەگەڕا...

"ڕاپۆرتێك دەربارەی زنجیرەیەكی نوێی داستانە عاشقانەییەكانی كوبی و ئەمریكیەكان".

_ بۆنس ئایرس(BUENOS AIRES)

سیگمۆند فرۆید(Sigmund Freud) لەوانەیە زەحمەت بووبێت بۆی وادابنێ، كە دووربێ لەزێدی خۆی، كەنەمسایە. ناوی فرۆیدا بەئاسانی و بەئەندازەی(كارلۆس گاردڵ)ی ئەفسانەی سەمای تانگۆ دەناسرێت.

"ڕاپۆرتێك لەسەر ژمارەیەك لەدەروونناسان لە ئەرژەنتین".

_ ئەفریقای باشور(SOUTH AFRICA)

پیاوێك جانتاكەی، كە پڕە لەكەلەرم و پەتاتە هەڵئەگرێت و ئەیخاتە ناو تاكسیەكی شڕەوەو نۆ كاتژمێر لەژێر هەتاوی گەرم و سوتێنەردا سەفەر ئەكات بۆ بازاڕی جۆهانسبۆرگ. كاتێك ئەگاتە ئەو شوێنە نیوەی بەروبوومەكەی گەنیوەو كاتێك ئەم باوكە پیرە 48 ساڵەیە ئەگەڕێتەوە بۆ لادێ هەژارو كەم درامەتەكەیان ئەبینێ چەند پێنیەكی كەم قازانجی كردووە.

"ڕاپۆرتێك لەسەر هەژاری ئەفریقای باشور".

وەكو هەرهەواڵێك ڕاپۆرتیش پێویستە دەستپێكێكی سەرنج ڕاكێشی هەبێت بۆئەوەی، بەشێوەیەكی لۆجیكی خوێنەران بۆلای خۆی ڕابكێشێت.

كاتێك داستان یان چیرۆكە هەواڵێك ئەنووسیت، كەهەندێ گۆشەی ناپەیوەستی هەیە وەكو ڕاپۆرتی سەفەر، ئەوخاڵانەی كەسەرنج ڕاكێشن لەسەر پارچە كاغەزێك بیاننووسەو پاشان بەشوێن ئەو خاڵانەدا بگەڕێ، كە بەشێوەیەكی ڕوون و ئاشكرا پەیوەندیان پێكەوە هەیە.

ڕستەكان پێكەوە گرێ بدەو هەوڵبدە بەجۆرێك بیگێڕیتەوە، كە لۆجیكی بێت و شێوازێكی ڕوون و ئاشكرای هەبێت. بەپێچەوانەی هەواڵ، كە ئەكرێ لەكۆتایدا ئەگەر پێویست بوو بیبڕی.

ڕاپۆرت پێویستە بەشێوازێك بنووسرێت، كە سەرەتاو ناوەڕاست و كۆتایی هەبێت. پەرەگرافی كۆتایی، كە هەندێ جار كیكەر(kicker)یشی پێ ئەوترێت، لەوانەیە دووبارە ئاماژە بەو بابەتانە بداتەوە، كە لیدەكە بەوە دەستی پێكردووە. هەندێك لەڕۆژنامەوانان بەسەختی هەوڵی ئەوە ئەدەن، كە كیكەرێكی زۆرباش بۆ ڕاپۆرتەكەیان بەدەست بهێنن، بەڵام زۆر هەوڵمەدە لەوانەبە ببێتە هۆی ئەوەی كۆتایی ڕاپۆرتەكە بەشێوەیەكی خراپ و زۆرلێكراوانە دەركەوێت.

ئاڕاستەیەكی ڕاپۆرت نووسین ئەوەیە، كە وەها دابنێیت وەكو كامیرایەكی سەتەلایتیت لەئاسماندا، یەكەمجار كامێراكە كەسێك پیشان ئەدات و كەسێتی و تەنگ و چەڵەمەكانی ئەخاتەڕوو، كە لێنزی كامێراكە ئەكرێتەوە خێرایی كەسەكەو تایبەتمەندیەكانی ئەبینی، تاچەند ڕووداوەكە كاریگەری هەبووە لەسەری. پاشان كامیراكە شارەكەیان پیشان ئەدات و لەكۆتایدا تەواوی ویلایەت یان وڵات پیشان ئەدات.

لێرەوە ڕیگاگەلێكی زۆر هەیە بۆ نووسینی لیدی ڕاپۆرت، ئەمانە هەندێكن لەو ڕیگایانە:-

_ بەڕاستەخۆیی(Straight)

بەشێوەیەکی ڕوون و ئاسان وەکو هەواڵ ڕاپۆرتەکە باس بکە، بەمەرجێك بابەتەکە بەڕادەی پێویست سەرنج ڕاکێش بێت. بۆنموونە/

ئەوە بەس بوو بۆ بولگاریە خۆشەبەختەکان، کە خاوەن ئۆتۆمبێلی خۆیان بن. (21مەی)ڕۆژێکی ڕەش بوو. کاتێك بەخەبەرهاتنەوە نرخی بەنزین 92٪ بەرزبووبوەوە.

_ ڕێك ئامانجەکە بپێکە، بدە لەخاڵ(hard hitting)

لەسەرەتادا سەرنجی خوێنەر ڕابکێشە، ئەویش بەئاماژەکردن بەخاڵە کارتێکەرەکان. بۆنموونە/

جەنگاوەرە لاوەکە هێمن دیاربوو کاتێك جگەرەیەکی بەدەمەوەو تفەنگەکەی لەبن دەستدابوو. تەنها دە 10 ساڵ تەمەنی بوو، بەڵام زیاتر لە دوازدە12 سەربازی حکومەتی کوشتبوو. یان گولو ئۆگاندا(GULU, Uganda)

کاتێك ئەو لاوە ئۆگاندایە زانی ئەو ژنەی لەکەمپی ئاوارەکاندا لەتاریکیدا پەلاماری دا دایکی بووە، خۆی بەداری کوخەکەیاندا هەڵواسی.

_ دواخستن(Delayed)

کاریگەری داستان یان چیرۆکە هەواڵەکە لەدوای چەند پەرەگرافێك دێت، بەڵام زۆر دوای مەخە. بۆنموونە/

کەش و هەوایەکی زۆر لەبار بوو، کە (قەڵای دراکولاَ) لەکۆتایی دۆڵە تەمگرتووەکاندا لەناو شاخەکانی ترانسلڤانیای ڕۆمانیادا دروست بکەن. هەرکە سەردانکەرەکان ئەو دەرگایەی جیڕەجیڕی ئەکرد پاڵیان پێوەی نا بۆئەوەی چاویان بە پیرەژنێکی سەراپا ڕەش بکەوێت سەگێك یان لەوانەیە گورگ بووبێت لەدوورەوە ئەیلوراند. ئەو پیرە ژنە بەشانازیەوە ئەوشوێنەی، کە ڤلاد دراکولا (Vlad Dracula) ڕابەری تینوو بەخوێنی سەدەی پانزە، کە ئەفسانەی دراکولاَ لەوەوە ئیلهامی وەرگرتووە. تیایدا کاری ئەکردو خواردنی ئەخواردو ئەنووست، پیشانماندا.

تەنها کێشەی گەورە ئەوە بوو، کە بەپێی ڕاگەیاندنی فەرمانگەی گەشتیاری ڕۆمانیا ئەو هەرگیز جارێك بۆ ئێرە نەهاتبوو.

بە کورتی ڕاپۆرتەکە زۆر قوڵ مەکەرەوەو مەیشارەوە، چونکە لەوانەیە خوێنەران وازی لێبهێننو نەیخوێننەوە، ئەو پەڕیەکەی لە پەرەگرافی چوارەمدا خاڵەکان باس بکەو بیانخەڕوو.

_ مێژوویی (Historical)

ئەم جۆرە لە دەستپێکردنی ڕووداوێکی مێژوویدا بەکاردێت. بۆنموونە/

سێ ساڵ لەمەوبەر مەنچوقستان ئاهەنگی کۆتایی هاتنی شەڕی خوێناویان گێرا، کە (100,000) سەد هەزار، خەڵکی مەدەنی کوژرانو ئابووری وڵات بە تەواوی تێکچوو...

_ گێڕانەوەیی (Narrative)

ئەم شێوازە داستان یان چیرۆکە هەواڵەکە، لەسەرەتاوە لەسەر شێوەی یەك لەدوایی یەك (کرۆنۆلۆجی) چۆن ڕووی داوە ئەگێڕێتەوە. ئەم شێوازە سەرنجی خوێنەر ڕائەکێشێ، بەڵام ئەبێت خێرا بەو خاڵە بگەیت، کە سەرنجی خوێنەران بەبەردەوامی تاکۆتایی رابکێشێت.

بۆنموونە/

لەبەیانییەکی ساردی زستانی مانگی نیساندا، سێ پیاو لە ناوەڕاستی لەندەندا چاویان بەیەکترکەوت. پاشان سێ تاکسی جیاوازیان گرتو بەرەو پێگەیەکی ئاسمانی لە نزیك کەناری دەریاوە کەوتنە ڕێ. هەریەکەیان ڕێگەیەکی جیاوازی گرتەبەرو لە کاتی جیاوازدا گەیشتنە سنورو سواری فرۆکەیەکی باری سۆڤیەتی بۆ فرینە 24 کاتژمێریەکان بوون بۆ باشور. سەرەنجام لە پێگەیەك لە ناوچەیەکی دوور کەوتوی بنکەی سەربازی پێشو لە بۆسنەدا دابەزین.

_ پێکەنیناوی (Humorous)

گاڵتەکردن ئاسان نیە، بەڵام ئەگەر لە لیددا بەباشی بەکاربهێنرێت کاری خۆی ئەکات و کاریگەری ئەبێت. بۆ نموونە/

تیرانا (TIRENA): چەند ساڵێك لەمەو پێش، دەسەڵاتدارانی کۆمەڵگای ئەلبانیا بەڵێنیان بە ژنان دا ئەگەر شەشە منداڵیان هەبێ ئەتوانن شەش ساڵ زووتر خانەنشین بکرێن، هەروەها ئەیانوت ئەگەر 12 منداڵیان هەبێ گایەکیشیان ئەدەینێ.

_ سەرگوزەشتەیی (Anecdotal)

ئەم جۆرە بەتایبەت کاتێك بەکاردێت، ئەگەر ڕاپۆرت دەربارەی کەسەکان بنووسیت. دیمەنەکە وەها دابنێ هەندێ شت دەربارەی رابردوویان باس بکەیت. بۆنموونە/

جۆن سیمس کارەکەی بە پاککردنەوەی گەورەترین دوکانی شار دەست پێکردو پاش دە 10ساڵ ئەو دوکانەی کڕیو بوو بە خاوەنی.

_وەسفی، پەسنی(Descriptive)

دیمەنێك دروستبکەو ئەوجا بچۆرە ناو بەسەرهاتەکەوە. بۆنموونە/

فرۆکەوانەکە کابۆیەك و تیشێرتێکی پرتەقاڵی و کلاوێکی یاری بەیسبۆڵ و سەندەلێکی لەپێدابوو. بەسەر جادەقیرەکەدا پیاسەی ئەکرد و وتی"باشە، کوڕینە بائەم نمایشە لەسەر جادەکە دەست پێبکەین"

نمایشەکە فڕین بە فرۆکەیەکی تەمەن سیودوو32 ساڵەی جۆری (DC3) بوو، وەپاش چەند چرکەیەك یەکێك لەو فرۆکە جیهانیانەی، کە کەم باسیکرابوو بەرو ئەو جەزیرەیەی حێ مەبەست بوو ڕۆشت.

شیکارکردن(Analysis)

شیکردنەوە هەلێکە بۆ تێڕوانینی قولأنە لەگۆشە نیگای جیاوازەوە بۆ بابەتی هەواڵ یان بۆبابەتێکی تر، کە بەلای خوێنەرانەوە سەرنج ڕاکێش بێت و خۆی هەواڵ نەبێت.

لەوانەیە لیدی شیکردنەوە زیاتر گشتی بێت وەك لەلیدی هەواڵی، بەلأم بنچینەکانیان هەریەکێکن: سەرچاوە دانانی باش، هاوسەنگی، پێشینەو وتە وەرگیراوەکان، بەپێچەوانەی هەواڵەوە پێویست بەوە ناکات ناوی سەرچاوە لەیەکەم یان دووەم پەرەگرافدا بێت، بەلأم لەکاتی داڕێژانی هەواڵدا پێویستە بەڕوونی ئەوزانیاریانە بخرێنە ڕوو، کە لەکوێوە هاتوون.

ڕێگایەکی نووسینی لیدی ئالۆز ئەوەیە، کە خاڵە سەرەکیو بنەڕەتیەکانو باکگراوندو وتە وەرگیراوەکان لەگروپەکانی 1، 2، 3 دا دابنێین ئەوەش لەسەر بنەمای بەڵگەو ئەوخالأنەی یارمەتی دەرن. ئەمەش وائەکات، کە ئاسانترو بەشێوەیەکی لۆجێکی بابەتەکان ڕێکبخەیتو خاڵە نەگونجاوو پێچەوانەکان پێکەوە دابڕێژین.

لێرەدا چەند پارچەیەك لەشیکاریەکی دەزگای ڕۆیتەرز ئەخەینە ڕوو:-

_ مۆسکۆ(Moscow)

لەئاشکراترین جولانەوەیدا بۆگەڕاندنەوەی متمانەی تازەدەوڵەمەندەکانی ڕوسیا سەرۆك فلادیمێر پۆتین بەڵێنی دا یارمەتیان بدات بۆگەڕاندنەوەی ئەو ملیارە دۆلارانەی، کە لەسالأنی نەوەدەکاندا بەشێوەیەکی نایاسایی براوەتە دەوەرەوە.

بەلأم ئایا هەزاران کەس لەڕوسیە دەوڵەمەندەکان، کە بەپێی هەندێك لەئامارەکان خەمڵێنراوە زیاتر لە(250)دوسەدو پەنجا ملیارد دۆلاریان لەدەرەوەی سنوری ڕوسیادا هەیە گاز لەوپارەوەی سەرۆك پۆتین دەگرن؟

_ لەندەن(London)

کەمکردنەوەی زۆرینەی گەل دۆستی لەوانەیە هەموو هەوڵەکانی تۆنی بلێر سەۆرك وەزیرانی بەریتانیا بۆ بەرو پێشبردنی ئەجێنداکەی لەپەرلەماندا تێکبشکێنێت و نەتوانی لەخولی سێیەمی هەڵبژاردنەکاندا بمێنێتەوە.

بەلاچوونی تۆزو خاکی هەڵبژاردنەکانی شەممە، کە تیایدا تۆنی بلێر بۆ سێیەمین جار سەرکەوتنی بەدەستهێنا و یەکەمین سەرکەوتنیشی بۆ حزبەکەی واتە حزبی کرێکاری چەپگەرا بوو، هەموو نیگاو سەرەنجەکانیش بەرەو لای ئەم حزبەدا ئەشکایەوەو تەنها 66 شەست و شەش کورسیان هەبوو، کە ماوەی پێشوو 161 سەدوشەست ویەك کورسیان هەبوو.

_ زانزیبار(ZANZIBAR)

لەپێش هەڵبژاردنەکان گرژیوئالۆزیە سیاسیەکان لەزانزیبار خەریکە زۆر بەتووندی پەرە ئەسێنێت بۆئەوەی تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو بێت بۆ ئەو وێنانەی، کە لەسەر سەقامگیری تەنزانیا گیراون. ئۆپۆزسیۆنەکان، کە لەدورگەیەکی نیمچە ئۆتۆنۆمیدان بەڵێنیاندا ڕێگا نەدەن بۆسێیەمین جار فڕوفێڵ بکریۆ دیسانەوە فریو بدرێن و لەبەر فڕو فێڵی هەڵبژاردنەکانی سالی (1995 و2000) بەراوێز بخرێن دابمرکێنەوە.

هەندێك ئەڵێن هەموو ڕاپۆرتێك لێکۆڵینەوەییە، لەبەر ئەوەی پەیامنێری باش هەمیشە بەشوێن ڕاستیەکاندا ئەگەڕێت یان باشترین ڕاڤەو گێڕانەوەی بۆئەکات و ئەیخاتە ڕوو. هەرچەند ڕاپۆرتە لێکۆڵینەوەییەکان چەندین خەسڵەت و تایبەتمەندی دیاریکراویان هەیەو ئەمانەن:-

_ ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە پێویستی بەکارکردن و توانای باش هەیە.

_ عادەتەن وەك ئاڕاستەو کۆمەڵێك ڕووداو دیارن وەك ئەوەی تەنها ڕووداوێك ڕوماڵ بکەن.

_ زۆرجار بەشوێن ئەو بابەتانەدا ئەڕۆن، کە پێشتر لەلایەن میدیایەکی ترەوە ڕوماڵ نەکرابێ.

_ هەمیشە پشت بەسەرچاوەی ڕەسەن و نوێ دەبەستن یان لەوانەیە پشت بەئاماری کۆمپانیانیان یان بەڵگەنامەکانی حکومەت ببەستن، کە شاردراونەتەوە.

_ بەزۆری لەسەر مەسەلەکانی تاوان و گەندەڵی یان خراپ بەکارهێنانی دەسەلاَت جێگیر دەبن.

_ هەندێ کات واپێویست ئەکات بەنهێنیەوە کاربکەیت( واز لەم بەشە بهێنەو دایبنێ بۆ پسپۆڕەکانی ئەو بوارە. هەندێ مەسەلەی بڕیاردانی ئەخلاقی هەیە، کە ئەگەر ڕێپۆرتەر بیاندۆزێتەوە لەوانەیە سەرئەنجامێکی توندی هەبێت بۆی بەتایبەتی ئەگەر ڕاپۆرتێکی لێکۆڵینەوەیی لەسەر تاوانەکانی ڕێکخراوێك ئامادەبکات).

لەهەندێ ولاَتاندا بەکارهێنانی ڕیکۆردەری شاراوە بەکارێکی نایاسایی لەقەڵەم ئەدرێت.

لێکۆڵینەوە بنەڕەتیەکان پێویستە تاکو ئەکرێ ئەو زانیاریانە ڕوماڵ بکەن و کۆیان بکاتەوە، کە لەناو خەڵکیدا دەست ئەکەون. پێویستە یاساو ڕێساکانی بەدەستهێنانی ئازادانەی زانیاری لەولاَتەکەتدا بخوێنیەتەوە. بەپشت بەستن بەم زانیاریانە ئەتوانی لێکۆڵینەوەکانی دەوڵەت و ڕاپۆرتی کۆمپانیاکان یان کتێبخانە گشتیەکان بەدەست بهێنیت.

ئینتەرنێت سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندە بۆئەوەی زانیاریەکانی تێدا دەربهێنیت، بەلاَم ئەوە بزانە ئەو زانیاریانەی، کە لەئینتەرنێتدا پەیدایان ئەکەیت بەتەواوی وردو ڕاست نین.

کاتێك ئەو زانیاریانەت وەرگرت سەرچاوەکەت هانبدە بۆئەوەی کەلێنەکان پڕبکەنەوەو وردەکاریەکی زیاترت پێبدەن. تەنانەت ئەگەر(off- the record )یش بێت واتە سەرچاوەکەش ڕازی نەبوو لەڕاپۆرتەکەتدا ناوی بهێنرێت. ئەگەر ڕاپۆرتەکەت کەسانێکی تاوانبارکرد بەوەی، کە کارێکی هەڵەیان ئەنجامداوە پێویستە پەیوەندی بکەی بەئەو کەسانەوە، بۆئەوەی وەلاَمت بدەنەوە تەنانەت ئەگەر "هیچ قسەیەکیان نەبوو" ئەبێت ئەو وەلاَمەشیان لەڕاپۆرتەکەتدا بنووسیت.

## چاوپێکەوتن، دیمانە(Interviewing)

_ ئامادەباشی (preparation)

هەتا پێت ئەکرێت زانیاری و پێشینە لەسەر ئەوکەسە یان ئەو ڕێکخراوەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەنجام ئەدەی کۆبکەرەوە، ئەگینا کاتەکەتان بەپرسیارکردنی سادەوئاشکراوە بەفیڕۆ ئەچێت.

ئەگەر خۆت ئامادەکردبێ ئەوا بەوکەسەی دیمانەی لەگەڵدائەکەی پیشان ئەدەی، کە تۆش ئەرکەکانی خۆت نووسیوە. ئەوەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە زۆرتر متمانەی بەتواناکانت هەبێت و زانیاری زیاترت پێ بدات.

_ پرسیاری بەرووپێشچووەکان(Advance questions)

ئەگەر کەسێك ویستت چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەنجام بدەیت و سووربوو لەسەر ئەوەی لەپێشدا پرسیارەکان ببینێت، ئەگەر پیشانتدا واهەست نەکەی کاتێك لەناو چاوپێکەوتنەکەدایە ئەبێ تەنها ئەو پرسیارانەی لێ بکەی، کەبۆت داناوە.واتە ئەتوانی پرسیاری تری لێ بکەیت.

_ سڵاوو بەخێرهاتن(Greetings)

سەرەتای چەند خولەکی یەکەم بەقسەکردن لەسەر شتەگشتیەکان تێپەڕێنن. ئەگەر باش خۆت ئامادەکردبێت بەدڵنیاییەوە ئەزانی ئەوکەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەکەی حەزی لەچ شتگەلێکەو ئەتوانێ قسەیات لەسەر بکات. ئەمانە هەموو ئەبنە یارمەتیدەر بۆئەوەی باری دەروونی ئارام بێت و کەش و هەوایەکی لەبار بێتە دی.

_ لەناوونیشانەکان وردبەوەرەوە(Check Names and titles)

_ پەیوەندی نیگاکان، زمانی جەستە(Eye contact, Body language)

کورسیەکەت بەجۆرێك دامەنێ ڕاست بەرانبەر مێزی کەسەکەی تربێت، ئەو شێوەیە لەوانەیە بێزاری بکات. هەندێ کورسیەکەت ڕابکێشە دواوەو بەرەو گۆشەیەك بیجوڵێنەو پاڵ بەرەوە. بەشێوەیەکی ئاسایی پەیوەندیەکی چاوی لەنێوان خۆت و ئەودا دروست بکە.

_ڕیکۆردەرو تێنووسی تێبینی(Tape-recorder, notebooks)

پرسیار بکەلەسەر ئەوەی ئەتوانی دەنگی تۆماربکەیت. ئەگەر ئەو کارەت ئەنجامدا ڕاستەخۆ ڕیکۆردەرەکە لەبەردەم ئەوکەسەدا دامەنێ، چونکە ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی بەردەوام بیر لەوەبکاتەوە، کە هەموو قسەکانی تۆمار ئەکرێت. ڕیکۆردەرەکە لەلایەکەوە دابنێ. هەوڵبدە یەکسەر تێنووسی تێبینی و یادداشتەکانت دەرنەهێنی. باشترە تێنووسەکەلەسەر ئەژنۆکانت بێت وەك ئەوەی لەسەر مێزی کەسەکەدا بێت.

_ پرسیارەکان کورتبن(Keep question short)

لەکاتی چاوپێکەوتندا ئەوەت لەبیر نەچێت تۆ هەوڵئەدەی لەوکەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەکەی زانیاری لەسەر بابەتەکەت وەربگریت نەك ئەوەی خۆت پیشان بدەی چەن زیرەکی.

_ لەسەرەتاوە پرسیاری سەخت مەپرسە(Don't ask difficult question first)

ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە بترسێت و چاوپێکەوتنەکە ببرێت. پرسیارە سەختەکان بهێڵەوە لانی کەم هەتاوەکو دڵنیا ئەبیت لەوەی وەڵامی چەند پرسیارێکت لەکەسەکە وەرگرتووە.

_هەندێك لەڕەخنەگرانت پێشنیازی ئەوە ئەکەن ئەمە ڕێگایەکی گونجاوە بۆ پرسیار کردنی سەخت. واپیشانبدە تۆ بەشداری لەدیدارەکەدا ناکەیت.

**_ پرسیاری کراوە بکە نەك داخراو**(Ask open, not closed question)

زۆرجار پرسیارە کراوەکان بەفرمان دەستپێئەکەن(ئەتوانی، ئەکرێ، ئایائەبێ)و زۆرجاریش بەیەك وشە وەڵام ئەدرێنەوە(بەڵێ)یان(نەخێر). هەوڵبدەپرسیاری کراوە بکەی"هەستت بەرانبەر ئەمە چیە؟""چی ئەبیستی؟. ""بۆچی ئەمە گرنگە؟""چۆن ئەمە باس ئەکەی؟".

هەمیشە شوێن بۆ پرسیاری داخراو هەیە، کاتێك هەوڵئەدەی بۆ بابەتێکی سەرەکی وەڵامی (بەڵێ) یان (نەخێر) بەدەستبهێنیت.

**_ لەفرە پرسیار کردن دووربکەوەرەوە**(Avoid multiple question)

لەکاتی چاوپێکەوتندا ئەم شێوازە ئەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکە بەسادەیی ئاسانترین پرسیار وەڵام بداتەوە.

**_ بێدەنگی بەکارمەهێنە**(Use the silences)

هەرکات لەبابەتەکەتدا بێدەنگی بوو، ئەوا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی مەڕۆ بۆ پرسیارکردن و لێوردبوونەوە... کاتی ئەوە بدە بە کەسەکە تاوەکو بیردەکاتەوە چی بڵێت، یان واز لەوەبێنی هەندێ زانیاری زیندووت دەداتێ.

**_ ئەگەر تێناگەی** (If you don't understand)

ئەگەر هەوڵ ئەدەی بزانی ئەو کەسە چی ئەڵێت، دەستەواژەکانی وەکو "ئەگەر تەواو تێگەیشتبم" یان "ئەم بابەتە چۆن بۆ کەسێکی ناو شەقامەکان ڕوون ئەکەیتەوە؟" بەکاربهێنە.

**_ ئایا شتێکی تر هەیە بیڵێی ؟** (is there any things else you should have asked?)

لە کۆتایی هەموو چاوپێکەوتنێکدا ئەم پرسیارە بکە. هەندێ جار ئەو کەسانەی چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ئەنجام ئەدەیت، هەندێ زانیاریان لا هەیە تۆ ئاگاداری نیت.

## کۆنفرانسە هەواڵیەکان (News Conferences)

---

**_ لە پێشەوە دابنیشە.** (Sit at the front)

لەکۆنفرانسە هەواڵیەکاندا لەپێشەوە دابنیشەو، خۆت بگرە بەرامبەر ئەوئەرکەی، کە بەڕێوبەری کۆنفرانسەکە بەکۆمەڵ پرسیار ئەکات. زیرەکی لە کۆنفرانسدا بە وەڵامدانەوی پرسیارە سوك‌وئاسانەکان ئەبێت‌و پرسیارە قورسەکانیش وەلائەنرێن.

**_ لە پێشینەکەی بکۆڵەرەوە** (Check the background)

ئەگەر شتێك لەسەر ئەو بابەتە ئەزانی، كە ڕومالّی ئەكەیت تا ئەتوانی زۆرترین پێشینەو زانیاری لەسەر كۆبكەرەوە، لەوانەیە پەیوەندی پێوەكردنەكان بتوانیٚ ئەو بابەتانەت بۆ روون بكاتەوە، كە ئەكریٚ وەك هەر پروپاگەندەیەكی تر بلاّوبكرێتەوە.

_ لەناوەكان بكۆڵەرەوە (Check the names)

عادەتەن لە كۆنفرانسە رۆژنامەوانیەكاندا بەشداربوان لەسەر بۆردێك ناویان ئەنووسرێت. لەناو تێنووسی تێبینیەكانتدا نەخشەیەك بكێشەو ئەوە دەست نیشان بكە، كە كیٚ لە كویٚ دانیشتوەو ژمارەیان بۆ دابنیٚ (1، 2، 3، .......) بەمشێوەیە ئەتوانی خێرا بزانی كیٚ لە دژی كیٚ قسە دەكات.

_ بەگروپ كاربكە (Work as a pack)

لە كۆنفرانسە هەواڵیەكاندا سەختەو دژوارە بتوانی بەدوای ئەو پرسیارەی كردووتە پرسیارێكی تر بكەیت.

وا باشترە لەدوای ئەو پرسیارەی، كە رێپۆرتەرەكانی تر ئەیكەن پرسیار بكەیت. هەمیشە پێكەوە كاركردنی رێپۆرتەرەكان ئەبێتە هۆی ئەوەی زانیاریەكی زۆر بەدەست بێت تاوەكو ئەوەی بە گروپی بچوك پرسیارگەلێكی تایبەت بكەی.

_ لەبەردەم دەرگاكەدا(Door- step)

لەكاتێكدا ئەندامانی كۆنفرانسە هەواڵیەكە هۆڵەكە بەجێئەهێڵن یان دێنە ژوورەوە هەوڵبدە بچیتە نزیكیانەوە و پرسیارەكانی خۆتیان لێبكەی. هەندێكیان خۆشحالّ ئەبن وەلاّمی پرسیارەكانت بدەنەوە.

_ بەشوێن رێپۆرتەری پسپۆردا بگەریٚ(Look for specialist reporter)

ئەگەر بەنیازی بابەتێكی هەوالّی ئالۆز یان بابەتێك زانیاریت لەسەر نیە رومالّ بكەی بەشوێن رێپۆیرتەری پسپۆردا بگەریٚ، یان ئەو كەسانەی لەپرسیارەكانیاندا دەرئەكەویٚ شتێك لەسەر رووداوەكان ئەزانن و دوای كۆنفرانسەكە قسەیان لەگەڵدا بكە.

عادەتەن كەسە پسپۆرەكان خۆشحالّ ئەبن بەزانیاریەكانیان بەشداری بكەن و زانیاریەك پێشكەش بكەن.

## كاركردن بەژمارەكان(Working with numbers)

---

پەیامنێران لەهەموو بوارەكانی رۆژنامەوانیدا لەگەلّ ژمارەدا كارئەكەن، لەبەر ئەوەی هەواڵەكانی دارایی و بازرگانی هەمیشە لەرووداوە گەورەوگرنگیە هەواڵیەكانی رۆژانەن. هەندێك لەرپەیامنێران كاتێك رووبەرووی ژمارە ئەبنەوە وشك ئەبن و واقیان ورئەمێنیٚ و باوەرپیشیان وایە: پەیامنێر+ ژمارە= هەڵەكردن.

بۆئەوەی باشترین هەواڵەكان لەژمارەكانەوە دەربهێنن ئەم چەند یاسا بنەرەتیە پەیربكەن:-

_ بەراوردو جیاوازی بكە(Compare and contrast)

خودی ژمارەرکان تەنها شتێکی زۆر بچوکمان پێ ئەڵێن. تەنها کاتێك لەگەڵ یەکتردا بەراورد ئەکرێن، ساڵی ڕابردوو، مانگی ڕابردوو، کۆمپانیاکانی تر مانایەکی تر ئەدەن بەدەستەوە.

**_ ژمارەکان چیرۆکە هەواڵەکان ئەگێڕنەوە**(Numbers tell stories)

تەماشای ئەولای ژمارەکانبکە تاوەکو هۆکاری گۆڕانکاریەکان ببینیت. ئامارەکانی مانگانە ئەوە دەرئەخەن، کە لەماوەی یەکساڵدا گەنمی هاوردەی مەنچوقستان دووئەوەندە زیادیکردووە. بۆچی؟ لەبەرئەوەی حکومەت کۆمەکی دارایی نانی پێشکەشکرد بۆ ڕێگە گرتن لەپەشێوی خەڵکانی مەدەنی.

**_ کەرت و ڕێژەی سەدی بەکاربهێنە باشترە لەژمارەکان**(Use fractions and percentages than figures)

نیو ملیۆن باشترە لە (500,000)هەزار. ژمارەتەواوەکان بەدەگمەن بەکاربهێنەو هەوڵبدە زۆر لەلیددا بەکاری مەهێنە.

**_ بەشوێن گۆشەنیگای مرۆڤایەتیدا بگەڕێ**(Look for the human angel)

خەڵکان حەزدەکەن دەربارەی مرۆڤەکان بخوێننەوە.چۆن نرخی قازانج بەرزئەبێتەوەو کاریگەری ئاسایی ئەکاتە سەر کڕیارەکانی  ئایا خەڵکان بەهۆی ئەمەوە کارەکانیان لەدەست ئەدەن؟.

## ئەخلاقیات، ئیتیك (Ethics)

---

لەهەر ولاتێکدا دامو دەزگا ڕۆژنامەوانیەکان خاوەن بنەماو ئەخلاقیاتی خۆیانن و ئەم بنەما جۆراوجۆرانە بەپێی ولات و مەرجە لۆکاڵیەکان ئەگۆڕێن و هەریەکەشیان هەندێ وردەکاری خۆی هەیە. هەرچەندە زۆربەی ڕێساکانیش لەسەر حاڵە سەرەکیەکان دەوەستنەوە.

**_ هەرگیز هەوڵی ئەوەمەدە هەواڵێك ساختە بکەیت یان هەواڵێکی تر بدزیت.**

**_ هەرگیز بەرتیل وەرمەگرە**(Never take a bribe)

هەندێك لەرۆژنامەوانانی ولاتە تازەپێشکەوتووەکان پارەیەکی کەم وەرئەگرن و ئەمەش ئەبێتە هۆی بکەونە بەر مەترسی بەرتیل وەرگرتن لەلایەن سیاسەتمەداران و کۆمپانیاکانەوە، بۆئەوەی لەبەرژەوەندی ئەواندا هەواڵێك بلاوبکەنەوە یان بەرانبەرەکانیان کپ بکەنەوە.

**_ هەمیشە ڕێگری بکە لەسەر داواکاریەکانی ئەو کەسەی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا ئەکەی، کە ئەیەوێ پێش بلاوکردنەوە بابەتەکەت ببینێت.**

**_ ئاگات لەخزمەتکردنی میوانپەروەریانە بێت**(Be wary of receiving hospitality)

ئاگاداربە لەم حاڵەتەدا هیچ جۆرە خواردنێکی نیوەڕوانی بەخۆڕایی نیە. ئەو خەڵك و ڕێکخراوانەی، کە بەشێوەیەکی ئاسایی میوانداری و خزمەت ئەکەن لەبەرامبەریدا هەندێ شتیان لێت ئەوێ.

_ هەرگیز ناوی سەرچاوەکانت ئاشکرامەکە.(Never reveal your sources)

لەهەندێك لەولآتاندا ڕێپۆرتەران ئامادە بوونە بچنە زیندانەوە تاوەکو ناوی سەرچاوەکانیان ئاشکرابکەن لەبەرانبەر داواکاریەکانی دادگادا.

_ بیروبۆچوونە سیاسیەکانی خۆت لەو ڕاپۆرتەی، کە ئامادەی ئەکەیت دوربخەرەوەو باسی مەکە.

## ئاسایش(Safety)

---

ئاسایش و سەلامەتی تۆ گرنگ‌و بەبایەخەو هیچ داستان‌و چیرۆکە هەواڵێکیش هەرچەند باش بێت شایەنی ئەوەنیە، کە ژیانی خۆتی بۆ بخەیتە مەترسی مردنەوە یان بەخەستی بریندار بیت.
ئەگەر لەشۆڕشێکی ناوشەقامدا دەستگیر بکرێیت ناتوانی هەواڵەکەت بلآوبکەیتەوەو سودی نابێت، ئەوکات بەتەواوی کاری ڕێپۆرتەری تۆ دیاریکراوو سنوردار ئەبێت.
ئەگەر ئەتەوێ خۆت بگلێنیتە بابەتێکی پرمەترسیەوە بەسەرنووسەرەکەت بڵێ‌و بۆی ڕوون بکەرەوە چۆن ئەتەوێ هەواڵەکەت ڕوماڵ بکەیت‌و ئەو مەترسیانەی ئەگەری ڕوودانی هەیە ڕوونی بکەرەوە.
ئەگەرئەتەوێ هەواڵی خۆپیشاندانێك ڕوماڵ بکەیت، کە لەوانەیە توندوتیژی لێبکەوێتەوە لەپێشدا شوێنەکە ببینەو پلانی ڕێگەی هەلآتنی خۆت دابرێژە.
زۆرێك لەپەیامنێران هەواڵی جەنگ‌و شەڕوشۆڕ ڕووماڵ ناکەن‌و چاوەڕوانی ئەوەیان لێناکرێ.
ئێستا هەندێك لەمێدیاکان پێش ئەوەی ڕێپۆرتەرەکانیان بنێرن بۆ ژینگەیەکی جەنگی بۆئەوەی هەواڵەکانی ڕوماڵ بکەن، کۆرسی فێربوونی چۆنیەتی کارکردن لەو ژینگە مەترسیدارانەیان بۆ ئەکەنەوە، ئەوەش زۆرجار لەلایەن ئەوسەربازانەوە بەڕێوەئەبرێت، کە پێشتر لەو شوێن‌و ژینگەیەدا کاریان کردووە.
ئەگەر بەنیازی ئەوەی ململانێ چەکداریەکان ڕوماڵ بکەی ئەم چەند یاسا بنەڕەتیانە ڕەچاوبکە:-

_ مەترسیەکان قورس‌و سوك بکە. واتە هەڵیان بسەنگێنەو ئەگەر شیاوی ئەوەبوون ڕوماڵیان بکەیت بڕیاری لەسەر بدە.

_ فێری فریاکەوتنی سەرەتایی ببە بەتایبەتی ئەوەی، کە چۆن خوێن بەربوون بوەستێنیت.

_ هەرگیز چەك هەڵمەگرە یان لەگەڵ ڕۆژنامەوانێك، کە چەکی هەڵگرتووە سەفەر مەکە.

_ ئەگەر پرسیارت لێکرا هەمیشە خۆت بەڕوونی بناسێنەو هەرگیز خۆت بەشتی تر یان کەسی تر جگە لەڕێپۆرتەری مەناسێنە.

_ هەمیشە جل‌وبەرگی مەدەنی لەبەربکە، مەگەر وەکو پەیامنێری فەرمی جەنگ داوات لێبکرێت جل‌وبەرگی تایبەتی لەبەر بکەیت. هەرگیز پۆشاکی سەربازی مەپۆشە.

_ زۆر ئاگات لەو ناوونیشانانە بێت، کە پێوەی دەچیتە ناو شوێنە گۆڕاوەکان، لەوانەیە ئەوە کاریگەری لەسەر بەرەیەکی تر هەبێت.

_ ئەگەر لەهێڵی پێشەوەی دوو بەرەدا کارئەکەی‌و هەرگیز زانیاری دەربارەی پرۆسەی سەربازی لایەك بەلایەنەکەی ترمەدە.

_ ئەو نەخشانەی، کە نیشانەیان لەسەرە لەگەڵ خۆتدا هەڵمەگرە، کە وابزانن تۆ سیخوڕیت‌و کاری سیخوڕی ئەکەیت.

_ ئەگەر لەبارودۆخێکدا گیرهاتی، کەخەڵکی هەڕەشەیان لێکردی هەوڵبدە بەهێمنی بمێنیتەوەو ئارامی خۆت بپارێزیت‌و هەڵسوکەوتێکی دۆستانەت هەبێت. با لەگەڵ خۆتدا جگەرەیەك یان شتێکی بچوکی گرانبەهای ترت پێ بێت بۆئەوەی بتوانی پێشکەشی خەڵکانی بکەی.

_ دەستبەندێك یان پارچەیەك ئاسن، کە گروپی خوێنەکەتی پێوەبێت لەدەست بکە بۆئەوحاڵەتانەی بریندار ئەبیت.

_ بەردەوام ئەو جۆرە پێلاوانە لەپێبکە، بتوانی کاتێك لەشوێنێکی زۆر مەترسیداردا کارئەکەی یان هەواڵێك ڕوماڵ ئەکەی بەباشی پێوەی ڕابکەی.

_ لۆکاڵیەکان لەکوێن، بۆ هەموو شتەکان نەمان‌و بێدەنگ بوون؟.

_ بترسە، ئەوە زۆر سروشتیەو بەلاَم مەتۆقیٚ‌و پەشێو مەبە.

_ زامن، بیمە. (Insurance)

ئەگەر لەشوێنێکی مەترسیداردا کارئەکەیت، ئاگاداری ئەوەبە، کە خاوەن کارەکەت وەکو پێویست تۆی بیمە کردبێت.

دوابەدوای بڵاوکردنەوەی پەرتوکی (میدیای نوێ) لە نووسینی ئاسۆ وەهاب دووەمین پەرتوک دەخەینە بەردەستی ئێوەی ئازیز بە زمانی شیرینی کوردی بە ئامانجی زیادکردنی ناوەڕۆکی ئەنتەرنێت بە زمانی شیرینی کوردی .




بۆ بەشداریکردن لەگەڵمان لەم پرۆژەیە پەیوەندیمان پێوە بکەن :
تەلەفۆن : +964 770 145 3495
ئیمێڵ : asowahab@gmail.com
سەردانی ئێرە بکە :
asowahab.blogspot.com